گۆڤاری قەڵای زانست
گۆڤارێکی زانستی وەرزی باوەڕپێکراوە لە لایەن زانکۆی لوبنانی فەرەنسی دەردەچێت-هەولێر-کوردستان-عێراق
بەرگی(٨) – ژمارە(٤)، پاییزی ٢٠٢٣
ژمارەی تۆماری نێودەڵەتی: ISSN 2518-6566 (Online) - ISSN 2518-6558 (Print)

# ڕۆڵی مەلا مستەفا بارزانی لە دامەزراندنی هێزی سەربازی نیشتمانی ڕێکخراو (1975-1943)

**قارەمان حیدر رحمان**
قوتابی خوێندنی بالا/ دکتۆرا- بەشی مێژوو، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، هەرێمی کوردستان، عێراق
qaraman.rahman@su.edu.krd

**پ. د. سەعدی عوسمان حوسێن هەروتی**
بەشی مێژوو، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، هەرێمی کوردستان، عێراق
dsaadi.haruti@su.edu.krd

## پوختە

ناوی ڕێبەری کورد مەلا مستەفا بارزانی ( ١٩٠٣- ١٩٧٩)، بەهۆی هەوڵەکانی لە پەرەپێدانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد، هاوواتای ناو و جەوهەری دۆزی کوردە لە مێژووی هاوچەرخدا. ئەم فەرماندەیە بە دروستکردنی هێزێکی سەربازی نەتەوەیی ڕێکخراو بە ناوی لەشکری شۆڕشگێری کوردستان، توانی گۆڕانی ئەرێنی لە بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورددا بهێنێتە کایەوە. ئەم هێزە کە لە نێوان ساڵانی 1943 بۆ 1975 بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕی، لە وێستگەکانی مێژوویی خۆیدا وەك هەر هێزێکی تری سەربازی سەر بە دامەزراوەیەکی نەتەوەیی بووە و ڕۆڵی خۆی لە بەرگریکردن لە شوناسی نەتەوەیی و پاراستنی خاک و خەڵقەکەی گێڕاوە. ئەمەش دوای ئەوەبوو کە مستەفا بارزانی توانی بەشێك لە هێزە هۆزایەتییەکان، تێکەڵ بە پێکهاتەیەکی ڕۆشنبیری ئەکادیمی ئاشنا بە پرەنسیپە سەربازییەکان بکات، لەناو سوپایەکی نیشتمانی ڕێکخراودا ، بۆ ئەوەی یەکێك لە توخمە سەرەکییەکانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد دەستەبەر بکات. وەک بنەمایەکی سەرەکی بۆ سەرکەوتن و بەردەوامبوونی.

## زانیاریەکانی توێژینەوە

**بەرواری توێژینەوە:**
وەرگرتن: ٢٠٢٢/١٠/١٨
پەسەندکردن: ٢٠٢٢/١٢/١٣
بڵاو کردنەوە: پایز ٢٠٢٣

**ووشە سەرەکییەکان**
*Mustafa, Barzani, Peshmerga, Kurdish, revolution*

**Doi:**
10.25212/lfu.qzj.8.4.8

گۆڤاری قەڵای زانست
گۆڤارێکی زانستی وەرزی باوەڕپێکراوە لە لایەن زانکۆی لوبنانی فەڕەنسی دەردەچێت-هەولێر-کوردستان-عێراق
بەرگی(٨) – ژمارە(٤)، پاییزی ٢٠٢٣
ژمارەی تۆماری نێودەڵەتی: ISSN 2518-6566 (Online) - ISSN 2518-6558 (Print)

## 1. پێشەکی

لەشکری شۆڕشگێڕی کوردستان وەک پێکهاتەیەکی سەربازی ڕێکخراوی نیشتمانی لەباشووری کوردستان لەساڵی ١٩٤٣ بەهەوڵ و کۆششی مەلا مستەفا بارزانی دامەزرا، ئەو خۆی لە دیمانەیەکی ڕۆژنامەوانیدا سەبارەت بەهۆکارەکانی پێکهێنانی ئەو هێزە دەڵێت:"هێزی پێشمەرگە وەک وەڵامدانەوەیەک بۆ پێویستیەکی مێژوویی و نەتەوەیی پێکهات ... وەکو هێزێکی بەرگری بۆ پاراستنی ژیان وکەرامەتی گەل". لەو توێژینەوەیدا ئێمە بەئامانجی ڕوونکردنەوەی ئەو ڕێکارانەی مەلا مستەفا بارزانی گرتیە بەر بۆ دامەزراندنی ئەو هێزە نیشتمانییە، توێژینەوەکەمان دابەشی سەر پێنچ باسکرد. لە باسی یەکەم، چەندین زانیاریمان لەسەر قۆناغەکانی(ڕێکخستنی هێزی پێشمەرگەی کوردستان) خستۆتەڕوو. لەسەرەتاشدا باسمان لەو ڕێکارانە کردوە کە هەر لە ساڵی ١٩٤٣ بەدواوە لەلایەن مستەفا بارزانییەوە گیرانەبەر بۆ پێکهێنانی پێکهاتەیەکی سەربازی نەتەوەیی. لە باسی دووەمدا، تیشکمان خستۆتە سەر پێکهاتەی لەشکری شۆڕشگێڕی کوردستان ، بە ڕێبەرایەتی مستەفا بارزانی. وێڕای ئەوەی باسی سێیەممان تەرخانکردووە، بۆ باسکردنی (سەرچاوەکانی کۆمەکی هێزی پێشمەرگەی کوردستان). ئەوە سەرباری ئەوەی لە باسی چوارەمدا باسمان لە خوولەکانی مەشق و ڕاهێنانی پێشمەرگە کردووە، لەباسی پێنجەمیشدا، شێوازەکانی شەڕی هێزی پێشمەرگەی کوردستانمان بە پێی نەخشە و ستراتیژی سەربازی مستەفا بارزانی وەک فەرماندەی لەشکری کوردستان، خستۆتەڕوو.

میتۆدی تویژینەوە، بریتییە لە بەکارهێنان و پیادەکردنی شێوازی شیکاری مێژوویی، بەسوود وەرگرتن لەو زانیارییانەی ڕۆڵی مستەفا بارزانیان لە دامەزراندنی ئەو هێزە بەدرێژایی قۆناغەکانی بزاڤی رزگاریخوازی کوردی لەماوەی نێوان ساڵانی (١٩٤٣_ ١٩٧٥) خستبووە ڕوو. ئەو سەرچاوانەی لەو توێژینەیەدا سوودمان لێوەرگرت، بەڵگەنامە فەرمییەکانی حکومەتەکانی ئەمریکا و بەریتانیا بوون، سەرباری سوود وەرگرتن لە بیرەوەری دیارترین فەرماندە باڵاکانی سەربازی سوپای عیراقی ئەو سەردەمە، وەک ئیبراهیم فەیسەل ئەنساری و ئیسماعیل تایهـ ئەلنعیمی، جگە لە چەندین ڕۆژنامە و گۆڤاری ئێرانی بە زمانی فارسی، لەبەرئەوەی هاوسەردەمی ڕووداوەکان بوون لە نموونەی ڕۆژنامەکانی ئیتلاعات و کەیهان و گۆڤاری مسەوەر.

گۆڤاری قەڵای زانست
گۆڤارێکی زانستی وەرزی باوەڕپێکراوە لە لایەن زانکۆی لوبنانی فەرەنسی دەردەچێت-هەولێر-کوردستان-عێراق
بەرگی(٨) – ژمارە(٤)، پاییزی ٢٠٢٣
ژمارەی تۆماری نێودەڵەتی: ISSN 2518-6566 (Online) - ISSN 2518-6558 (Print)

## 2. ڕێکخستنی هێزی پێشمەرگەی کوردستان( ١٩٤٣-١٩٥٨)

توێژەرێکی ئەمریکی لە شێوازەکانی شەڕی ناڕێکخراو لە ڕۆژهەلاتی ناوەراست، مەلا مستەفا بارزانی بە دامەزرێنەری هێزی سەربازی ڕێکخراوی نیشتمانی کورد دەناسێنێ و ئاماژە بۆ ئەوە دەکات ئەو سەرکردەیە دوای بەشداریکردنی لە بزاڤەکانی شێخ مەحمودی حەفید لە ١٩١٩ و شێخ سەعیدی پیران لە ١٩٢٥ و ئارارات (ئاگری داغ) ١٩٢٧_ ١٩٣٠ .بیرۆکەی یەکخستن و یەکگرتنی هێزە کوردییەکانی لەبیردا گەلالە بوو، پاشان بەتێکەڵبوونی لەگەڵ ژمارەیەک لە نیشتمانپەروەرانی کورد لەماوەی دوورخراوەیی لەنێوان سالآنی ( ١٩٣٣_ ١٩٤٣ ) لە موسڵ و سلێمانی، بیری نەتەوەیی گەشەی کرد، دوای ئەوەی لە تەمووزی ١٩٤٣ گەڕایەوە زێدی خۆی لەبارزان ، بریاری هەڵگیرسانی بزاڤێکی دیکەی دا. ئەو بزاڤە، بیرۆکەی پێکهێنانی هێزێکی ڕێکخراوی نیشتمانی لە ڕێگای یەکخستنی هێزی هۆزەکان لەلای بارزانی گەلالە کرد (Lortz ,2005, p.20).

مستەفا بارزانی دوای هەڵگیرسانی بزاڤەکە، بانگەوازی بۆ هۆزە کوردیەکان کرد پشتگیری بکەن، لەگەڵ وەلامی ئەرێنی بەشێکیان بۆ داواکارییەکەی، یەکەم هەنگاوی بۆ دامەزراندنی هێزێکی نیشتمانی کوردی لەژێر فەرماندەیی و سەرکردایەتی خۆی هەلێنا (Khorsheed ,2020, p.15).

هێزەکەی بارزانی لە ماوەی چەند مانگێکی کەم، ژمارەی جەنگاوەرانی گەیشتە (٢) هەزار کەس. لەپێناو ڕێکخستنیان، دابەشی سەر چەند دەستەیەکی شەڕکەر کران و ئەرک و بەرپرسیارەتی بەڕێوەبردنیانی بەهەر یەک لە محەمەدئەمین میرخان و مامەند مەسیح و ساڵح کانی لەنجی سپارد(بارزانی، ١٩٩٨،ل٨٩).

سەبارەت بە چۆنیەتی هەڵسوکەوت و ڕەفتاری سەربازییان، بارزانی چەندین ڕێنمایی و ڕاسپاردەی بەهێزەکانی دا، لەمانەش پێویستی گوێڕایەڵی جەنگاوەران بۆ فەرمانەکانی سەرووی خۆیان و جێبەجێکردنیان و پێویستی ڕەفتارکردنی فەرماندەکان لەگەڵ جەنگاوەران بەشێوەیەکی برایانە و ئامۆژگاریکردنیان لەسەر چۆنیەتی هەڵسوکەوت کردنیان لەگەڵ خەڵکی سڤیل و دیلەکانی دوژمن و شێوازی دابەشکردنی دەستکەوتەکانی شەڕ (Lortz ,2005, p.20).

لەقۆناغی دووەمی شۆڕشەکەدا، دوای ڕێکنەکەوتنی مستەفا بازرانی لەگەڵ حکومەتی عێراقی لەساڵی ١٩٤٥، دەستەیەک لە ئەفسەرانی ئازادیخوازی کوردی کە لە ڕیزی سوپای عێراقی بوون و سەر

گۆڤاری قەڵای زانست
گۆڤارێکی زانستی وەرزی باوەڕپێکراوە لە لایەن زانکۆی لوبنانی فەرەنسی دەردەچێت-هەولێر-کوردستان-عێراق
بەرگی(٨) – ژمارە(٤)، پاییزی ٢٠٢٣
ژمارەی تۆماری نێودەڵەتی: ISSN 2518-6566 (Online) - ISSN 2518-6558 (Print)

بەرپێکخستنەکانی حزبی هیوا[1]بوون، هاتنە پاڵ بزاڤی دووەمی بارزان (ئەردەلانی ، ٢٠٢٢، ل٣٤). ئەو پێشهاتە، کاریگەریی ئەرێنی لەسەر نزیکبوونەوەی بارزانی لە خواستە نەتەوەییەکانی هەبوو، بۆ دروستکردنی سوپایەکی نیشتمانی. پاڵپشتی حزبی هیوا و ئەفسەرە ئازادیخوازەکانی کورد، هەنگاوی دامەزراندنی ئەو هێزە نیشتمانییەی خێراتر کرد، بەو جۆرەش یەکێک لە توخمە سەرەکییەکانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردی لە ١٥ی کانوونی دووەمی١٩٤٥ لەگەڵ دامەزراندنی رێکخراوێکی خاوەن پێکهاتەیەکی سەربازی بەناوی ( لیژنەی ئازادی ) بە پێشەوایەتی مستەفا بارزانی، وەک بنەمایەکی سەرەکی بۆ دامەزراندنی سوپا و لەشکرێکی سەربازی رێکخراو، لە باشووری کوردستاندا دەستەبەر بوو (O'Ballance ,1973, p.47).

مستەفا بارزانی دوای ئەوەی وەک فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکانی شۆڕش لەلایەن لیژنەی ئازادی دەستنیشانکرا، دەستیکرد بە رێکخستنی هێزەکانی و بەسەر بەرەکانی شەڕ لە بارزان و ئاکرێ و ئامێدی دابەشیکردن، لەو سۆنگەوە مستەفا خۆشناو(١٩١٢_١٩٤٧) وەک فەرماندەی لەشکر لەکەرتی (مێرگەسۆر _ رەواندز) و عزەت عەبدولعەزیز وەک فەرماندەی کەرتی (ئامێدی) و شێخ سلێمان بارزانی بە فەرماندەی کەرتی (ئاکرێ) دەستنیشانکران. ئەم فەرماندانە بە سەرکردایەتی گشتیی هێزەکانی شۆڕش کە مەلا مستەفا خۆی بەڕێوەی دەبرد بەسترانەوە(بارزانی، ١٩٩٨،ل١١٥)؛ بەم شێوەیە ئەو گۆڕانەی لەپێکهاتە و ستراتیژی خەباتی چەکداری پێشمەرگەدا هاتەدی، هۆکاری سەرەکی بوو بۆ ئەوەی ئەو هێزە گوزارشت لە بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردی بکات (Lortz ,2005, p.23).

ئەو هێزانەی بەدرێژایی ماوەی بزاڤی دووەمی بارزان رێکخران، لە دوای ٢٥ی ئابی ١٩٤٥ سەرکەوتنی گەورەیان بەسەر لەشکری حکومەتی عێراقی بەدەستهێنا(بارزانی، ١٩٩٨،ل133-130)، ئەگەر خیانەتی سەرۆک هۆزەکان و یارمەتییەکانی هێزی ئاسمانی بەریتانیا نەبوایە، سوپای عێراقی لە سەرکەوتنی بەسەر شۆڕشی کورد، نائومێد دەبوو (Rudolph ,2015, p.271). بەڵام ئەو هەماهەنگییە سەربازییەی نێوان حکومەتەکانی عێراق و بەریتانیا، دەرئەنجامەکەی پەڕینەوەی مستەفا بازرانی و

---

[1] - حزبی هیوا: بەر لەهەڵگیرسانی جەنگی دووەمی جیمانی، جەند نێشتمانپەروەرێکی کورد لەبەهاری ساڵی ١٩٣٩ لە باشووری کوردستان بریاریاندا لەسەر پێکهێنانی بەرەیەکی یەکگرتوو، بەسەرۆکایەتی رەفیق حلمی(١٨٩٨_١٩٦٠). لەشوباتی ١٩٤٤ پارتەکە تووشی لێکتری هەڵوەشانەوە بوو، بوونە دوو باڵ. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەم کۆمەڵەیە بگەڕێوە بۆ: هلبین محمد أحمد المزوري، حزب هیوا- الامل(1939-1946)،سبیریز، دهوك،2008.

ئەندامانی سەرکردایەتی لێژنەی ئازادی بوو (بارزانی، ١٩٩٨،ل١٤٩). بۆ ڕۆژهەلاتی کوردستان و پاڵپشتیکردنی کۆماری کوردستان لە مەهاباد .

دوای دامەزراندنی کۆماری کوردستان بەسەرۆکایەتی قازی محەمەد لە کانوونی دووەمی ١٩٤٦، پێکهاتەیەکی دیکەی سەربازی ڕێکخراو لە مێژووی بزاڤی رزگاریخوازی کوردی دامەزرا (Waisy 2015, p.26)، کە وەزیری جەنگ و سوپا سالار و چوار ژەنەراڵی هەبوو، لە نێویاندا مستەفا بارزانی وەک یەکێک لە فەرمانده باڵاکانی سەربازی کۆمار پلەی ژەنەراڵی وەرگرت و لەگەڵ ئەو هێزەی لەگەڵیدابوو ئەرک و بەرپرسیارەتی پاراستنی کۆماری کوردستانی لەبەرەی باشووری رۆژهەڵات کەوتە ئەستۆ، بە جۆرێک لەکۆی (١٢٧٥٠) جەنگاوەری کورد، (١٨٠٠) یان لەژێر فەرماندەیی ئەودا بوون (Lortz ,2005, p.29).

دوای دامەزراندنی حکومەتی کۆماری کوردستان. وەزارەتی بەرگری لەو حکومەتە، دەستی بەشاڵاوەکی بەرفراوانکرد بۆ گۆرینی ئەو زاراوەی فارسیانەی لەناو سوپا بەکاردەهاتن و لە بەرامبەردا بەدوای دەستەواژەی کوردی رەسەن دەگەڕان لە شوێنیان دابنێن . یەکەمین دەستەواژەی وەزارەتی بەرگری کۆماری کوردستان دەستیکەوت، ناوی (پێشمەرگە- الفیدائی) بوو لە شوێنی ناوی (سەرباز- جندی). بەو شێوەیە وەک لۆرتزی لێکۆلەری ئەمریکی باسی دەکات، یەکێک لە دەرهاوێشتە ئەرێنییەکانی بەشداریکردنی مستەفا بارزانی لەگەڵ هێزەکەی لە کۆماری کوردستان، بەدەستهێنانی نازناوی ( پێشمەرگە ) بوو بۆ جەنگاوەرانی، لەشوێنی بەکارهێنانی ناوی (سەرباز) بەزمانی فارسی، بەو جۆرەش بارزانی وەک فەرماندەی هێزی پێشمەرگە، لەدوای ڕووخانی کۆماری کوردستان، بەردەوامی بە خەباتی چەکداریدا، لەبزاڤی رزگاریخوازی کوردیدا (Lortz ,2005, p.34).

ڕۆژنامەنووسی ئەمریکی جوناسان ڕاندل، وای بینی کە هاتنی مەلا مستەفای بارزانی بە پێشەوایەتی جەنگاوەرانی بۆ کوردستانی ئێران وەک دیارییەکی خودایی چاوەڕواننەکراو بوو بۆ قازی محەمەدی سەرۆکی کۆماری کوردستان. لەبەرئەوەی ئەوەی دوایی لەو کاتەدا هیچ جۆرە سوپا و لەشکرێکی شەرکەی رێکخراوی بەتوانای نەبوو، ئەوەندە نەبێ لەلایەن خەڵکی دانیشتووی شاری مەهاباد و هەندێک لە ڕۆڵەی هۆزە کوردییەکان لە ئێران پشتگیری دەکرا ( راندل، ١٩٩٧، ص١٧٠). بەو هۆیەوە توێژەرێکی مێژوویی هێزەکەی بارزانی بە بڕبڕەی پشتی کۆماری کوردستان داناوە (Tahiri ,2007, P.46). توێژەرێکی دیکەش ئەوان بە گەورەترین و ڕێکخراوترین هێزی سەربازی کۆمار دەناسێنێ و

ژمارەی تۆماری نێودەڵەتی: ISSN 2518-6566 (Online) - ISSN 2518-6558 (Print)

ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە دوای ئەوەی جارێکی دیکە چەکدارکرانەوە و لەچەند یەکەیەکی سەربازیدا ڕێکخران و لەچەندین شەڕدا بەرامبەر سوپای ئێرانی لەبەرەی سەقز، بەرگری بەهێزیان لە کۆمار کرد، توانیان زیانی ماددی و گیانی زۆر بەهێزەکانی ئێران بگەیەنن .(P.Chapman ,2009, P.46)

دواجار ڕووخانی کۆماری کوردستان لە١٧ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٦، بووە هۆی لەناوچوونی ڕێکخستنە سەربازییە کوردییەکە، دوای ئەوەی زۆربەی جەنگاوەران گەڕانەوە ناو هۆزەکانیان، بارزانی خۆی و هێزەکەی بەتەنیا مانەوە، ئەو کاتە لەوە گەیشت ئەوان بەتەنها لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان ناتوانن ئەو هێزە ئامادەبن پارێزگاری لە پاراستنی ئەو قەوارە کوردیە بکەن، لەبەرامبەر سوپا و لەشکری ئێران، بەهۆی نەبوونی پاڵپشتی هۆزەکانی ئەو ناوچەیە، بەتایبەتی کە ژمارەیەکیان، هێزەکانی خۆیان دایە پاڵ هێزەکانی ئێران (Lortz ,2005, PP.31_35).

مستەفا بارزانی بەهۆی هاتنە پێشەوەی ئەو دۆخە سەربازییە، خۆی و هێزەکەی لە ١٩ ی نیسانی ١٩٤٧ لە ئێراندا پەڕینەوە ناو خاکی عێراق (P.Chapman ,2009, p.47). بەڵام نەیانتوانی لەناوچەکە بمێننەوە، لەئەنجامدا بۆ جارێکی دیکە لە ٢٧ی ئایاری ١٩٤٧ بڕیاریدا بگەڕێتەوە ناو سنووری ئێران و لەوێشەوە بە ٥٢ ڕۆژ و دوای بڕینی ٣٠٠ کم و چەندین شەڕ و ڕووبەڕووبوونەوەی سەربازی لەگەڵ سوپای ئێرانی، لە ١٨ی حوزەیرانی ١٩٤٧ لەگەڵ هێزەکەی پەڕینەوە ناو سنووری یەکێتی سۆڤییەت(Zhigalina,2013, p.109).

یەکێک لە ئامانجەکانی بارزانی لەو ڕێپێوانە مێژووییەدا، پاراستن و پارێزگاریکردن بوو لەو هێزەی، داینەمۆی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی بوو لە باشووری کوردستان. هێزە کوردییەکە کاتێک پەڕینەوە ناو خاکی سۆڤییەت، ماوەیەک لە مستەفا بارزانی جیاکرانەوە(بارزانی، ١٩٩٨،ل١٩٥). بەڵام دواتر لە 2ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٧ بەهۆی هەوڵەکانی ئەوەی دوایی هەموویان لە باکۆی پایتەختی ئازەربایجانی سۆڤیەتی بەیەکەوە کۆکرانەوە (Zhigalina ,2013, C.114). ئەمەش واتای دانەبڕانی سەرکردەبوو لە پێشمەرگەکانی.

لە باکۆ، مستەفا بارزانی جارێکی دیکە هێزەکەی ڕێکخستەوە و فەوجێکی لێ پێکهێنان و ئەسعەد خۆشەوی (مەلازادە ، ٢٠٢١، ل١٥). بە فەرماندەی فەوج و هەریەک لە ( سەعید وەلی بەگ وحەمەدەمین میرخان و مامەند مەسیح و مستۆ میرۆزی) بە فەرماندەی(سریە) دەستنیشانکران. حکومەتی ئازەربایجان یەکێک لە فەرماندە سەربازییەکانی بەناوی (کازمۆف)ی بە سەرپەرشتیاری مەشق

ژمارەی تۆماری نێودەڵەتی: ISSN 2518-6566 (Online) - ISSN 2518-6558 (Print)

پێکردنیان دامەزراند (بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد١٩٣١-١٩٥٨, ١٩٩٨، ل١٩٧). پاشان جلوبەرگی سەربازی و چەکی تازەی روسییان بۆ دابینکراو و خرانە ناو خولێکی مەشق و راهێنانی سەربازی لەژێر سەرپەرشتی ئەفسەرانی سۆڤیەتی وەک ( کولییف و کریموف و زینالوف و مامیدۆف)، لەپێناو ئامادەکردنیان بۆ ئەنجامدانی پرۆسەی سەربازی رێکخراو (Zhigalina ,2013, C.114). ئەو هەنگاوە بەهەر مەبەستێک بووبێ، سەرەنجام ئەزموون و توانای سەربازی پێشمەرگەکانی بارزانی زیادکرد و لەگەڵ هێزی سەربازی رێکخراو ئاشنا بوون.

وەکو پێشتر باسمانکردووە، ژیانی بارزانی و هەڤاڵەکانی لەماوەی حکومرانی جۆزیف ستالین(١٩٢٢-١٩٥٣) تاکوو مردنی لە ئاداری ١٩٥٣، زەحمەت و دژوار بوو، بەڵام لەگەڵ ئەو گۆڕانە ئەرێنییەی لە پێکهاتەی حوکمرانی سۆڤییەت ڕوویدا، گۆڕانی ئەرێنی بەسەر بارودۆخی بارزانییەکاندا هات، بەتایبەتی دوای دیداری بارزانی لە حوزەیرانی ١٩٥٣ لەگەڵ خرۆتشۆف(١٩٥٣-١٩٦٤) ی سەرۆکی نوێی سۆڤیەت (کۆچی ١٩٩٠، ص٤٤). دوای ئەم دیدارە، بارزانی لیستی ناوی (١٠٤) لاوی کوردی ئامادەکرد کە یاوەری بوون، بۆئەوەی حکومەتی سۆڤیەت بیانخاتە زانکۆکانی (بیلاروسیا) بەمەبەستی فێربوونی زانستە جۆراوجۆرەکان و تەواوکردنی خوێندن. ئەوانەی ناویان لەو لیستەدا بوو، بەسەر چوار بەش دابەشکران و ڕەوانەی زانکۆکانی ( سیراتۆف، گۆرکی، ئیستانۆف و تامپۆف) کران، ژمارەیەکی دیکەشیان چوونە زانکۆی تاشقەند(بارزانی، ١٩٩٨،ل٢١٣). بارزانی پێگەیاندنی ئەو لاوانەی لەڕووی مەعریفییەوە، وەک پێداویستییەکی سەرەکی جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی سەیرکرد. هەر بەو ئامانجەش دوای ڕێپێدان و کارئاسانی حکومەتی سۆڤیەت بۆ ئەو داواکارییەیان، خۆی هاوشێوەی هەڤاڵەکانی لە ئەکادیمیای سیاسی سۆڤیەتی لە موسکۆ بەمەبەستی ئاشنابوون و تێگەیشتن لە زانستی سیاسی، دەستی بە خوێندن کرد (Примаков ,2006, C.325). ئەم داواکارییە بۆ فێربوون لە بنەما سەرەکییەکانی هزری نەتەوەیی مستەفا بارزانی بوو، بۆیە لە قۆناغەکانی بەرایی خەباتی سیاسی خۆیدا زیاتر جەختی لەسەر کردۆتەوە، تەنانەت پێویستی فێربووون و ئاشنابوونی گەنجانی کوردی بە زانست و زانیاری هاوچەرخ، لە وتاری دامەزراندنی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی کورد لە ١٩ی کانوونی دووەمی ١٩٤٨ لە باکۆی پایتەختی ئازەربایجان خستەڕوو وەک خاڵێکی بنچینەیی لە چوارچێوەی ستراتیژی نیشتمانی بۆ داهاتووی کوردستان (بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد١٩٣١-١٩٥٨, ١٩٩٨، ل٣٥٧).

### 3. ڕێکخستنی هێزی پێشمەرگەی کوردستان ( ١٩٦١-١٩٧٥)

دوای ئەوەی بۆ ماوەی (١١) لە ئاوارەیی ژیانی بەسەربرد ، بارزانی لە ڕۆژی ٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٨ و پاشان هەڤالەکانی لە ١٦ی نیسانی ١٩٥٩ لە ئەنجامی سەرکەوتنی شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ گەڕانەوە عێراق (اطلاعات ،ش (٩٨٨٠)، ٩ فروردين ١٣٢٨، ص٤). بەڵام ئەو ژیانە ئارامەی کە لە عێراق بۆیان دەستەبەربوو، زۆر درێژەی نەکێشا و دیسان کردەی سەربازی و پێشمەرگایەتی بە هۆی هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلوول (١٩٦١- ١٩٧٥) دەستپێکردەوە. ئەو کاتەی شۆڕشی کورد لە ١١ی ئەیلوولی ١٩٦١ هەڵگیرسا، هێزەکانی بارزانی بەو ژمارەیە نەبوون، چاوەڕوانی ئەوەیان لێ بکرێ بتوانن بەشێوازی شەری بەرەیی، پارێزگاری لەمانەوەی خۆیان بکەن. بۆیە بەهۆی هاوسەنگ نەبوونی هێز لەنێوان هەردوولا، بەپشت بەستن بە ئەزموونی ڕابردووی لەشەڕی پارتیزانی، بارزانی بڕیاری پیادەکردنی ئەم پلانە سەربازییەی دا، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هێزەکانی حکومەتی عیراقی (Gunter ,1992, P.13).

لەسەرەتای هەڵگیرسانی ئەو شۆڕشە، ژمارەی پێشمەرگە کەمبوون، بارزانی لەدیدارێکی ڕۆژنامەوانی لەگەڵ چەند پەیامنێرێکی ڕۆژنامەی(نوفافريميا)ی ڕوسی، ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە لە ئەیلوولی ١٩٦١ کاتێ سوپای عێراقی هێرشی کردۆتە سەر کوردستان، تەنها (٦٠٠) شەڕکەری چەکداری هەبووە، ئەو دەڵێ هەرچەندە خەڵکی دیکە هەبوون کە ئامادەبوون بەرگری لە وڵاتەکەیان بکەن، بەڵام چەک و پێداویستی سەربازییان نەبوو، بەهۆی نەبوونی پاڵپشتی دەرەکی بۆ هێزە کوردیەکان. بۆیە لەو کاتەدا شۆڕش بۆ چەکدارکردنی پێشمەرگەکانی، پشتی بە دەستکەوتەکانی شەڕ بەست (خواندنيها (مجلة)،ش (٥٢)، ١٢مارس١٩٤٤).

لەلایەکی دیکە ڕێکخستنی هێزی پێشمەرگە زۆر لاوازبوو، ئەو چەکەی بەدەستیانەوە بوو بە پێوەری نوێی سەربازی، سادە و ساکاربوو. تەنانەت ئەو هێزانە لەو کاتانەی لەبەرەکان جەنگ بوون، هیچ پاڵپشتیەکی سەربازییان نەبوو، بەڵکو بەهۆی کەمی چەکی قورس و خزمەتگوزارییە تەندروستییەکان، ڕووبەڕووی ئارێشەی زۆر دەبوونەوە. جگە لەمانەش ئامێری بێتەلی پێویستیان بۆ ڕوومالکردنی مەودایەکی دیاریکراو و پەیوەندیکردن بە سەرکردایەتی خۆیان لەبەردەست نەبوو (Dann ,1969, p.339). بارزانی نەبوونی چەکی قورسی بەگەورەترین مەترسی و هەڕەشە لەسەر شۆڕش داناوە، بەڵام بە بڕوای ئێمە نەبوونی کارمەندانی تەندروستی لەپاڵ هێزەکانی پێشمەرگە ئەوەندەی تر

مەترسیدار بووە، تەنانەت دۆخی مرۆیی خەمناکی لێکەوتۆتەوە، بەجۆرێک کاتێک پێشمەرگەیەک لەبەرەکانی شەڕ زامدار دەبوو، ئەو کارمەند و پێداویستییە تەندروستیانەی پێویست بوون بۆ تیمارکردنی بەردەست نەبوون (پەیامی ئەیلوول(گۆڤار) ، ژ(٢١)، تەمووزی ٢٠١١، ل٥٣،٥٢). سەرەڕای ئەوەش، وەکو لەژێدەرێکدا هاتووە ئەوەی هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان لەگەڵ بوونی ئەو کەموکورییانە ئەنجامیان داوە، ئەستەم بووە بە هیچ هێزێکی سەربازی ڕێکخراو لەو قۆناغە ئەنجام بدرێ" (Dann ,1969, p.339).

بەمەبەستی چارەسەرکردنی ئەو بارودۆخە، مستەفا بارزانی لە٣١ی تشرینی یەکەمی ١٩٦١ بە یاوەری نزیکەی ٣٠٠ پێشمەرگە ڕوویکردە ناوچەی عەشیرەتی نێروە لە بادینان (محمد ، ٢٠٢١، ل٢٦)، ئەو کاتەی گەیشتە ئەو ناوچەیە، ڕاستەوخۆ دەستیکرد بە ڕێکخستنی یەکەکانی هێزی پێشمەرگە، لەو سۆنگەوە بڕیاریدا بە دامەزراندنی چوار هێز کە هەر هێزێک ژمارەی پێشمەرگەکانی نزیکەی (٢٥٠) کەس دەبوون بە فەرماندەیی هەریەک لە محەمەد ئەمین میرخان مێرگەسۆری و حاجی بێرۆخی(١٩١٦-١٩٧٥)(گەردی ، ٢٠٢١). و عیسا سوار لە دەڤەری زاخۆ (مەلازادە ، ٢٠٢١، ل١٦). و حەسۆ میرخان دۆلەمەری (١٩٢٣_ ١٩٩٦) لە دەڤەری شێخان (سەرنی ، ٢٠١٨، ل٦٩). هەروەها عەلی خەلیل خۆشەوی بۆ دەڤەری دهۆک. بۆ هەر یەکێک لەم فەرماندانە، چەند یاریدەدەرێک و ( ئەسعەد خۆشەوی)شی وەک جێگری خۆی دیاریکرد. ئینجا ئەرکی پاراستنی خۆی و بارەگاکەی بە هێزێکی دیکە سپارد بە فەرماندەیی عەزیز محەمەد دۆڵەمەری (مراد ، ٢٠٢١، ص٦٠).

ئەو ڕێکارە سەربازییانەی بارزانی لەسەرەتای شۆڕشەکە لەدەڤەری بادینان ئەنجامیدا ، ڕێکای بەپەلە و خێرابوون و پێویستیان بە پێداچوونەوە و ڕێکخستنەوەیەکی نوێ هەبوو، بۆیە لەڕۆژی ٢٥ تاکو ٢٩ی کانوونی یەکەمی ١٩٦١ لەگوندی (عەودالان) کۆبوونەوەیەکی بەرفراوانی سەربازی ڕێکخست و لەو کۆبوونەوەیەدا بڕیاریدا هێزەکان جارێکی دیکە ڕێکبخاتەوە و دوای ڕاوێژکردنی لەگەڵ ئامادەبوون، بڕیارياندا ناوی (پێشمەرگە) وەک ناوی جەنگاوەرانی کورد و شۆڕشەکەش بە شۆڕشی ئەیلوول و هێزی شۆڕشگێڕی کوردستانیش بە (هێزی پێشمەرگە) بناسێنن، هەر لەو کۆبوونەوەیەشدا دروشمی کوردستان یان نەمان بەرزکرایەوە (شەریف ، ٢٠١٢، ل٨٥).

لەدوای تێپەڕبوونی چەند ڕۆژێک، بەدیاریکراویش لە٥ی کانوونی دووەمی١٩٦٢، بارزانی بڕیاری لەسەر پێکهێنانی دوو ( لق )ی هێزی پێشمەرگە دا لەسەر شێوازی هێزی سەربازی ڕێکخراوی عێراقی، کە

هەریەک لەوانە لە سێ ( پەل ) وهەر پەلێکیش لە سێ ( دەستە) پێک دەهات (بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد، بگ:٣،، ب: ١، شۆڕشی ئەیلول ١٩٦١_١٩٧٥ ٢٠٠٤، ل١٨٧). بەڵام هیچ کامێک لەو دوو لقانە شوێن و بارەگا و بنکەیەکی دیاریکراویان نەبوو، بەڵکو بەپێی پێویستی دۆخەکە، جوولەیان بەو هێزانە کردووە لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە (Dann ,1969, p.339).

ئەو رێکخستنانەی لەریزی پێشمەرگە ئەنجام دران، کاریگەرییان لەسەر گۆڕینی ئاراستەی شەڕ و دروستکردنی جۆرێک لە هاوسەنگی هێز هەبوو، بەو هۆیەوە لەماوەیەکی کورتدا لە زستانی ١٩٦١_١٩٦٢، هێزەکانی پێشمەرگە توانیان دەست بەسەر چەندین ناوچە و ڕووبەری بەرفراوانی زەوی دابگرن، وەک دەست بەسەرداگرتنی قەزای زاخۆ و بەرەی ( دهۆک_ ئامێدی). سەرەرای ئابلوقەدانی شارۆچکەی ئامێدی (سەرنی ، ٢٠١٨، ل٦٤_٦٥).

لەلایەکی دیکە لە دەوروبەری شاری هەولێر، شارۆچکەی کۆیە و چیای سەفین کەوتنە ژێر دەسەڵاتی هێزەکانی پێشمەرگە. لەپارێزگای سلێمانیش پێشمەرگە چوونە ناو شارۆچکەکانی هەلەبجە و چوارتا و تەوێلە و شارۆچکەی پێنجوێنیان ئابلووقەدا. تەنانەت لەدەوروبەری شاری کەرکوک، توانیان دوای زاڵبوون بەسەر هێزەکانی حکومەتی عێراقی، ناحیەی قادر کەرەم و سەنگاو دەست بەسەردا بگرن و هەوڵیاندا رێگای کەرکوک_ سلێمانی بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان. هاوکات چەندین جار هێرشیان کردە سەر دامەزراوەکانی نەوت، بەئامانجی راگرتنی بەرهەمهێنانی نەوت لەو کێڵگانەی لەناوچەکەدا بوون (الانصاري ، ٢٠١٩، ص١٤٨_١٤٩).

ئەو هێرشە پارتیزانیانەی هێزی پێشمەرگە ئەنجامی دەدان، تەنها بۆ سەر مۆڵگە و بنکە و بارەگاکانی سوپای عیراقی نەبوو، بەڵکو بەشێک لەناوچە و سنووری ئەو هۆزانەشی گرتەوە، کە لەسەنگەری دوژمنانی پێشمەرگەبوون و لە شەڕدا هاوکار و یارمەتیدەری حکومەتی عێراقی بوون بەتایبەتی ئەو هۆزانەی لە سنووری پارێزگای موسڵ بوون، بۆیە هێزی پێشمەرگە لەگەڵ دەستپێکردنی پرۆسە پارتیزانییەکانیان هێرشیان کردە سەر هۆزەکانی زێباری و هەرکی کە لەناوچەی (گردەسین) بوون و هەروەها هێرشیان کردە سەر هۆزی شەرفانی و گوندەکەیان ئابلووقەدان (الانصاري ، ٢٠١٩، ص١٤٩).

لەپێناو رێکخستنی کاروباری بەرەکانی شەڕیش، بارزانی چەندین رێنمایی بە هێزەکانی پێشمەرگە داوە، وەک دوورکەوتنەوە لە چوونە ناو گوندەکان لەژێر هەر بیانوێک بێ، ئەمەش بۆ پاراستنیان لە بۆردومانی ئاسمانی، هەروەها رێنمایی پێداون کە نابێ لە رێگەی هێزەوە کەلوپەل لە خەڵکی گوندەکان

زەوت بکەن و پێویست بوو لەسەریان ملکەچی ئەو فەرمانانەبن کە لەلایەن فەرماندەکانەوە دەردەچن و بەبێ دوو دڵی جێبەجێیان بکەن، وێرای هەوڵدان بۆ بەفیرۆنەدان و دەستگرتن بە زەخیرەی جەنگ و گرتنەبەری ئامادەکاری پێویست بۆ خۆپاراستن لە بۆردومانی تۆپ و فرۆکە (محمد ، ٢٠٢١، ل٢٦_٢٧).
لەلایەکی دیکە هێزەکانی پێشمەرگە ڕێنمایی پێویستیان لە بارزانی وەرگرت سەبارەت  بە شێوازی دەستنیشانکردنی خاڵە لاوازەکانی دوژمن بۆ ئەوەی لەو خاڵانەوە هێرش بکەنە سەریان و دووربکەونەوە لە کوشتن یان ئازاردان یان شکاندنی ئابڕووی دیلەکانی دوژمن و هەوڵبدەن هاوکاریی هاوبەشیان لەگەڵ هێزەکانی دیکەی هاوسەنگەریان هەبێ و لەکاتی شەڕدا یارمەتی یەکتری بدەن و پەناببەنە بەر شێوازی شەڕی پارتیزانی و دابەشی سەر چەند گروپێکی بچووکبن، بۆ کەمکردنەوەی قەبارەی قوربانیەکان (محمد ، ٢٠٢١، ل٢٦_٢٧).
هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە ئاداری ١٩٦٢ بەدواوە لە ڕووی چەندایەتی و چۆنایەتییەوە، بەرە و گەشەکردنێکی خێرا هەنگاوی نا و لقەکانی گەیشتنە(١٥) لق (شەریف ، ٢٠١٢، ل٩٢_٩٣). دوای ئەوەی هەر لەو مانگەدا ناوچەیەکی بەرفراوانی زەوی لە سنووری سوریا تاکوو خانەقین، بەدرێژایی ٣٠٠ میل و پانی نزیکەی ٧٠ میل کەوتە ژێر دەستیان (Dann ,1969, p.338).
مستەفا بارزانی بەو هۆیەوە لە نیسانی ١٩٦٢ ، جارێکی دیکە هێزەکانی پێشمەرگەی لە بادینان ڕێکخستەوە و دابەشی سەر سێ هێزی کردن و  ئەسعەد خۆشەوی بە فەرماندەی گشتی دەڤەری بادینان و محەمەد ئەمین میرخان، بە فەرماندەی هێزی گورزوەشێن لەژێر سەرپەرشتی خۆی دانا و عیسا سواری کردە فەرماندەی کەرتی زاخۆ کە (٦٠٠) پێشمەرگەی لەگەڵدا بوو، هەروەها عەلی خەلیل کە نزیکەی ( ٣٥٠-٤٠٠ ) پێشمەرگەی لەگەڵدا بوو بە فەرماندەی بەرەی شەڕ لەدهۆک دامەزراند و ( حەسۆ میرخان دۆلەمەری ) ئەرکی پاراستنی کەرتی شێخانی پێسپێردرا، کە ئەمیش نزیکەی (٤٠٠) پێشمەرگەی لەگەڵ بوو (مراد ، ٢٠٢١، ص٦٠).
لە ئابی ١٩٦٢ ژمارەی لقەکانی پێشمەرگە دووبارە زیادیان کرد، بۆیە لەدەڤەری سۆران هەموویان بوونە یەک هێز بەناوی (کەرت) و بارەگای سەرەکیان لە (چەمی ڕێزان) کردەوە و جەلال تالەبانی(١٩٣٩-٢٠١٧) وەک بەرپرسی گشتی ئەو بەرەیە دیاریکرا (مەلازادە ، ٢٠٢١، ل١١).
بەم شێوەیە (هێزی پێشمەرگەی کوردستان)، تا ڕادەیەک وەک هێزێکی ڕێکخراوی سەربازی دەرکەوت. هەریەکە لەو پێکهاتە سەربازییانەی بۆ ئەو ناوچانە دەستنیشانکران کە لە چوارچێوەی دەسەلاتیان

گۆڤاری قەڵای زانست
گۆڤارێکی زانستی وەرزی باوەڕپێکراوە لە لایەن زانکۆی لوبنانی فەرەنسی دەردەچێت-هەولێر-کوردستان-عێراق
بەرگی(٨) – ژمارە(٤)، پایزی ٢٠٢٣
ژمارەی تۆماری نێودەڵەتی: ISSN 2518-6566 (Online) - ISSN 2518-6558 (Print)

دابوون و هەمان سیستمی سوپای عێراقیان بەسەر پیادە کرا، پاشان دەست بە پێکهێنانی بەتالیۆن و لق و پەلی سەربازی دیکە کرا (محمد ، ٢٠٢١، ل٢٨). بەشێوەیەک دوای ئەو قۆناغە یەکەکانی هێزی پێشمەرگە لە گەورەوە بۆ بچووک لە (بەتالیۆن، لق، پەل، دەستە) پێک دەهات (مەلازادە ، ٢٠٢١، ل١١).

دوای تێکچوونی بارودۆخەکە لە کۆتایی نیسانی ١٩٦٣، مستەفا بارزانی بۆ جارێکی دیکە بڕیاریدا ڕیزەکانی پێشمەرگە ڕێکبخاتەوە و بەرەکانی شەڕی لە خانەقین تاکوو زاخۆ بۆ سەر (١١) ناوچە دابەشکرد، ژمارەیەک لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و لێژنەی مەرکەزی پارتی هەڵبژارد و ئەرک و بەرپرسیارەتی بەرەکانی شەڕی پێ سپاردن (مراد ، ٢٠٢١، ص٦١). بەم شێوەیە ڕێکخستنی هێزەکانی پێشمەرگە لەگەڵ بەرفراوانبوونی ناوچەکانی ژێر دەسەلاتیان و زیادبوونی ژمارەیان، تا کۆتایی شۆڕشەکە بەردەوام بوو .

## 4. پێکهاتەی لەشکری شۆڕشگێری کوردستان

لەسەرەتاکانی هەڵگیرسانی شۆڕشی کورد لە ئەیلوولی ١٩٦١، هێزەکانی پێشمەرگە ڕێکخراو نەبوون، مستەفا بارزانی وەک ڕێبەری شۆڕشەکە، هێزەکانی خۆی دابەشی سەر دوو پێکهاتەی سەربازی کرد، یەکەمیان ئەو هێزانە بوون کە لەبەرەکانی شەڕدا بەردەوام ئامادەبوونیان هەبووە، بەشەکەی دیکە پێکهاتەیەکی هۆزایەتی بوو، کە هێزێکی شەڕکەر بوون، بەڵام بەشێوەیەکی تەقلیدی گورزیان لەهێزەکانی حکومەتی عێراقی دەوەشاند و دوای ئەنجامدانی چالاکییەکە، دەگەڕانەوە ماڵەکانی خۆیان و دەستیان بەکاروباری ڕۆژانەی خۆیان دەکردەوە (غريب ، ١٩٧٣، ص٥٩). ئەو پێکهاتە سەربازییە نارێکخراوەی دوایی پێی گوتراوە ( بەرگری میللی ). هەمیشە وەک هێزێکی یەدەگ دەرکەوتوون و ڕۆڵیشیان لە بەشێک لەسەرکەوتنەکانی هێزی پێشمەرگەدا هەبوو. چەک و تەقەمەنیەکانیان، خۆراک و جلوبەرگ و پێخەفەکانیان لەئەستۆی خۆیاندابووە، ئەوەندە نەبێ لەژێر فەرمانی مستەفا بارزانی فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکانی کورد بوون (غمبار ، صوت الاخر(مجلة)، ع(40)، 21 أذار 2005، ص٧).

بارزانی دوای ماوەیەک گەیشتە ئەو باوەڕەی کە پێویستە ئەو هێزانە لەچوارچێوەی هێزێکی ڕێکخراودا کۆبکرێنەوە، ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٦٤ لەگەڵ دامەزراندنی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان، دامەزراوەیەکی تایبەت بە پێشمەرگە و سیستەمێکی سەربازی بۆ ڕیکخستن و

گۆڤاری قەڵای زانست
گۆڤارێکی زانستی وەرزی باوەڕپێکراوە لە لایەن زانکۆی لوبنانی فەڕەنسی دەردەچێت-هەولێر-کوردستان-عێراق
بەرگی(٨) – ژمارە(٤)، پایزی ٢٠٢٣
ژمارەی تۆماری نێودەڵەتی: ISSN 2518-6566 (Online) - ISSN 2518-6558 (Print)

سەرپەرشتیکردنی ئەو هێزانە دانا، لەگەڵ دابینکردنی تۆڕێکی بێتەل و چەک و زەخیرەی پێویست لە جۆری چەکەکانی ( بەریتانی و ئێرانی و ئەمریکی و روسی) کە پێکهاتبوون لە تفەنگی ئەلمورزی تورکی کۆن و رەشاش و تفەنگەکانی وەک ئەلستن و برن و مۆرتەر و بازوکا. کە رێژەی(٢٠%)ی ئەو چەک و زەخیرانە لەدەرەوەی کوردستان بەرێگەی ئێرانەوە دەگەیشتنە ناوچە ئازادکراوەکانی ژێر دەسەڵاتی هێزەکانی پێشمەرگە (غريب ، ١٩٧٣، ص٦١).

ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانی عیراق، دوای ئەوەی لە ٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٤ دامەزرا، راستەوخۆ دەستوورێکی بۆ ڕاپەراندنی کاروبارەکانی شۆرش دەرکرد، بەپێی ماددەی دووی ئەو دەستوورە کە تایبەت بوو بە پێکهێنانی سوپای شۆڕشگێری کوردستان، دامەزراوەی سەربازی وەک دەزگایەکی فەرمی لەناوچە ئازادکراوەکانی شۆڕش پێکهات. ئەمەش گۆڕانێکی ئەرێنی بوو بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری هێزەکانی پێشمەرگە، دوای ئەوەی پێکهاتەیەکی سەرکردایەتی ڕێکخراو بە فەرماندەیی مستەفا بارزانی و نوری مەلا مەعروف وەک سوپا سالار و ئەسعەد خۆشەوی بە فەرماندەی تیپی یەک لەدەڤەری بادینان و رەشید سندی (پەیامی ئەیلوول(گۆڤار)، ژ(١١)، ئاب و ئەیلوولی ٢٠٠٩، ل٣٩) به فەرماندەی هەولێر و عەزیز عەقراوی(نجم ، ٢٠٢١، ص٦٧) بە فەرماندەی ناوچەی سێیەم دامەزران و ئەرک و بەرپرسیارەتی ئەو هێزەیان کەوتە ئەستۆ (محمد ، ٢٠٢١، ل٢٠١).

بەگوێرەی سیستەمی سەرکردایەتی گشتی شۆڕشی کوردستان ،ژمارە(١) بۆ ساڵی ١٩٦٤، بە پشت بەستن بە مادەی(٣) لە دەستووری ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانی عێراق و مادەی (٩)ی تایبەت بە پێکهێنانی نووسینگەی ڕاپەڕاندن( مەکتەبی تەنفیزی) لە ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش، لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٤ لەدوای رەزامەندی مستەفا بارزانی فەرماندەی گشتی هیزە چەکدارەکان ، بریار لەسەر پێکهێنانی (ئەنجومەنی بەرگری نیشتمانی) درا. ئەو دامەزراوەیە، ئەندامە سەرەکییەکانی لە سوپا سالاری لەشکر و جێگرەکەی پێک دەهات و ئەندامانی دیکەی وەک لە دەستووری ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانی عێراقدا هاتووە، لە فەرماندەی تیپەکان و ئەندامانی راوێژکاری لە بەڕێوەبەرەکانی ( جووله، مەشقکردن و پلاندانان، ئاسایش و هەواڵگری، کارگێری، میرە، خواردەمەنی و گرێبەست و فرۆشتن، ژمێریاری، ووردبینی، کەلوپەلی پزیشکی، ریزەکان، سەرۆکی دادگەی باڵای سەربازی، راوێژكاری دادی)پێکهاتبوو (نانەکەلی ، ٢٠١٧، ل٤٠_٤١).

گۆڤاری قەڵای زانست
گۆڤارێکی زانستی وەرزی باوەڕپێکراوە لە لایەن زانکۆی لوبنانی فەرەنسی دەردەچێت-هەولێر-کوردستان-عێراق
بەرگی(٨) – ژمارە(٤)، پاییزی ٢٠٢٣
ژمارەی تۆماری نێودەڵەتی: ISSN 2518-6566 (Online) - ISSN 2518-6558 (Print)

هێزی پێشمەرگەی کوردستان لەساڵی ١٩٦٤ ناوی (لەشکری شۆڕشگێری کوردستان)ی لێ نرا و لەسەر فەرمانی بارزانی دوای ڕاوێژکردن بە ئەنجوومەنی بەرگری و مەکتەبی تەنفیزی ، بە سەر سێ لەشکر دابەشکران، هەر لەشکرێک لە (٣) یان (٤) هێز پێکهاتبوو (مەلازادە ، ٢٠٢١، ل١١). ژمارەی ئەندامانی پێشمەرگە لەو یەکە سەربازیەدا ( ٥٠٠٠_ ٦٠٠٠) کەس بوو (محمد ، ٢٠٢١، ل٢٠٦). هەر هێزێک لەو لەشکرە لە (٣) بەتالیۆن پێک هاتبوو (مەلازادە ، ٢٠٢١، ل١١)، ژمارەی پێشمەرگەکانی (١٥٠٠_٢٠٠٠) کەس بوون، هەر بەتالیۆنێکیش لە (٣) لق کەمتر نەبوو. ژمارەی پێشمەرگەکانی (٤٠٠_٥٠٠) کەس بوو (محمد ، ٢٠٢١، ل٢٠٦)، هەر لقێکیش لە (٣) پەل پێکهاتبوو، هەر پەلێکیش لە (٣) دەستە کەمتر نەبوو، هەر دەستەیەکیش لە (١٠) پێشمەرگە کەمتر نەبوو (مەلازادە ، ٢٠٢١، ل١١).

بەئامانجی دووبارە دابەشکردنی هێزەکان بەسەر بەرەکانی شەڕ لە کوردستان، مستەفا بارزانی بڕیاریدا لە زاخۆ تاکوو خانەقین هێزەکان دابەش بکاتەوە بۆ سەر سێ کەرت کە پێکهاتبوون لە کەرتی بادینان کە لەسنووری شارەکانی( دهۆک، زاخۆ، ئاکرێ، شێخان، ئامێدی) پێکهاتبوو، هەروەها کەرتی هەولێر کە سنووری ناوچەکانی( باڵەک، سەفین، دەشتی هەولێر) لەخۆ دەگرت و کەرتی سێیەم سنووری ناوچەکانی ( قەرەداغ، ئاغجەلەر، سورداش، شارباژێر، خانەقین)ی دەگرتەوە (مراد ، ٢٠٢١، ص٦١).

شیاوی باسە لە سەرەتای هەڵگیرسانی شۆڕشی کورد لە ئەیلوولی ١٩٦١ پێکهاتەی هێزەکانی پێشمەرگە زۆربەیان لە ڕۆڵەی هۆزە کوردەکان و خەڵکی دێهاتەکان بوون (مراد ، ٢٠٢١، ص٧٢). بەشێکی دیکەشی لە پێکهاتە ئایینی و نەتەوەییەکانی دیکەی کوردستان بوون، لە نموونەی کلدان و ئاشوریەکان (یوسف ، ٢٠٠٩، ص٢٢٤). بەپێی زێدەرێک، مسعود بارزانی لە بۆنەیەکدا لە شاری دهۆک سەبارەت بە ڕۆڵی کریستیانەکان لە شۆڕشی ئەیلوولی١٩٦١، ئاماژەی بەوە داوە، کە کریستانەکان بەشداری شۆڕشی ئەیلوولیان کردووە و چەندین قارەمانیان بە گوێرەی ناساندنی ئەو، خۆیان بەختکردوە، وەک هورمز مەلەک چەکۆ(1932- 1963) (الرديني ، ٢٠١٠، ص٧).

کریستیانەکان لە شۆرشی ئەیلوول بەگشتی لەنێو بەتالیۆنێکی تایبەت بەخۆیان لە گوندی (سیتکی) لە پشت چیای ئەلقوش کۆبوونەوە. ئەو بەتالیۆنە لەسەر فەرمانی مستەفا بارزانی لەساڵی ١٩٦٤ بەناوی ( هورمز مەلەک چەکۆ) کراوە (الرديني ، ٢٠١٠، ص٧_٢٢).

شیاوی باسە ئەو هێزە چەندین دەستەی شەڕکەری لە خۆگرتبوو کە لەلایەن فەرماندە دیارەکانی کریستیان سەرپەرشتی دەکران لە نموونەی ( تۆما تۆماس، ئەشیعیا ئیسرائیل سرستکی). پاشان لە

ژمارەی تۆماری نێودەڵەتی: ISSN 2518-6566 (Online) - ISSN 2518-6558 (Print)

نیسانی ١٩٦٤ بە فەرمانی مەلا مستەفا بارزانی (تلیا شینۆ) دەبێتە فەرماندەی ئەو هێزە و بارەگاکەیان لە دۆڵی (دێر رەهبان) دەگوازنەوە بۆ گوندی ( دیبری) لە ناوچەی نەهلە. دواجار ژمارەی پێشمەرگە کریستانەکان لەناو شۆڕش لەماوەی نێوان ساڵانی ( ١٩٧٣- ١٩٧٥) بەهۆی پەیوەندیکردنی ژمارەیەکی زۆری گەنجانەکانیان لە ناوچەکانی( کرنجوک، بیروزاڤا، تلسقوف، باطنایا، تەلکییف، باتوفا)، دەگاتە (٥٧٠) پێشمەرگە و لە پێنچ ( دەستە ) کۆکرانەوە. کریستانەکان تەنانەت ئافرەتێکیشیان بەناوی مارگرێت جۆرج شیلو(١٩٤٢-١٩٦٩) لەریزی هیزەکانی پێشمەرگەدا بووە (الرديني ، ٢٠١٠، ص٧_٢٢).

عەرەبەکانیش هاوشێوەی پێکهاتەکانی دیکەی نەتەوەیی، دوای ئەوەی عەبدولکەریم قاسم یاسای چاکسازی کشتوکاڵی دەرکرد، ژمارەیەک لە شێخەکانی عەرەب لە دەوروبەری موسڵ، دژی ئەو یاساییە ڕاوەستان، بەوهۆیەوە پەیوەندیان بە ریزی شۆرشی ئەیلوول کرد و لەژێر فەرماندەیی ئەسعەد خۆشەوی لە دەڤەری سەرسەنگێ جێگیرکران. ئەوە سەرباری ئەوەی بەشی زۆری ئەوانەی ئەندامی حزبی شیوعی بوون و دوای کودەتای ٨ی شوباتی ١٩٦٣ لە عێراق، بەهۆی ڕاوەدونانیان لەلایەن حزبی بەعس ، ڕوویانکردە ناوچە ئازادکراوەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕشی کورد و لەسەر فەرمانی مستەفا بارزانی هەموو دەرگاکانیان بۆ والاکران، وەک وەڵامدانەوەیەک بۆ ئەو هەڵوێستەی بارزانی یەکەیەکی تایبەتی سەربازییان لەناو هێزی پێشمەرگەی کوردستان لەژێر فەرماندەیی بارزانی دامەزراند و لەدوای ساڵی ١٩٦٣ وە بەشداری شۆڕشی کوردیان کرد (Primakov , 2006, C.329). وێڕای بەشداریکردنی کوردانی پارچەکانی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا و باکووری کوردستان (دەحلێنەوی ، ٢٠٢١، ل٩). هەموو ئەمانەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو متمانەییەی مستەفا بارزانی بۆ بەرامبەرەکانی دروستیکردبوو، لەئەنجامی داکۆکیکردنی لە مافی هەمووان بەبێ جیاوازی. وێرای باوەڕی ئەو خەڵکە، بەو داواکارییانەی بارزانی خەباتی لەپێناو دەکرد.

سەرباری هێزەکانی پیادە، بارزانی گرنگی بە پێکهێنانی دەزگای هەواڵگری سەربازی و یەکەی تۆپخانەی شۆڕش داوە. دامەزراوەی یەکەم وەک لە برگەی سێ لە مادەی حەوتەمی دەستووری ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانی عێراقدا بەناوی ( بەڕێوەبەرایەتی کاروباری ئاسایش و هەواڵگری) هاتووە، لەبەشەکانی هەواڵگری سەربازی و ئاسایشی سەربازی پێکهاتبوو. ئەرکی بریتی بوو لە ڕێکخستنی پەیوەندییە گشتییەکان و پروپاگەندەکردن بۆ شۆڕشی کورد و سانسۆردانان لەسەر چاپکراو و بڵاوکراوەکان و وەرگرتنی هۆکانی پێویست بۆ شاردنەوەی نهێنی سەربازی (نانەکەلی ،

ژمارەی تۆماری نێودەڵەتی: ISSN 2518-6566 (Online) - ISSN 2518-6558 (Print)

٢٠١٧، ل٤٥)، زیاتر لەوەش کاریکردوە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری سەربازی لەسەر هێزەکانی سەربازی حکومەتی عێراقی (Lortz ,2005, p.41).

یەکێک لە ژێدەرەکان سەبارەت بەکاریگەریی ئەو دامەزراوەیە لەسەر بارودۆخی شۆڕش ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە مستەفا بارزانی زانیاری هەواڵگری لەناو هەموو عێراق هەبوو، تەنانەت لەنێو دامەزراوە سەربازییەکانی حکومەتی عێراقی زانیاری هەواڵگری پێدەگەیشت. بەشێوەیەک هێزەکانی عێراق بەر لەوەی جووڵە بکەن بەمەبەستی هێرشکردنە سەر بنکە و بارەگاکانی پێشمەرگە، بارزانی زانیاری لەسەر تەواوی ئەو هێزە و ئامانجەکانی هەبوو، بۆیە بەپێی زانیارییەکانی ئەو ژێدەرە هێزە عێراقییەکان بەر لەوەی بگەنە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش، بارزانی ڕێنمایی پێویستی بۆ بەرگریکردن و خۆپاراستن بە هێزەکانی پێشمەرگە داوە (تهران مصور(مجلة)، ش(١١٧١)، جمعة ٢٢ بهمن ١٣٦٦، ١١ فوريه ١٩٤٤، ص١١٨).

بەمەبەستی ئاشناکردنی پێشمەرگە لەسەر بەکارهێنانیی چەکی قورس، هەشت پێشمەرگەی بە پلە جیاوازەکانی سەربازی لە ساڵی ١٩٦٥ ڕەوانەی ئێران کران، دوای مانگێک لە وەرگرتنی زانیاری پێویست، ئەو پێشمەرگانە گەڕانەوە باشووری کوردستان و بوونە هەوێنی دامەزراندنی یەکەی تۆپخانەی شۆڕش. بۆ یەکەمجار لەساڵی ١٩٦٥ لەکاتی هێرشێکی سوپای عیراقی بۆسەر چیای سەفین لە باکووری شاری هەولێر، لەسەر فەرمانی مستەفا بارزانی لە ڕۆژی ٢٠ی نیسانی ١٩٦٥ چەند گوللە تۆپێکیان گرتە سەربازگەی زیارەت لەپشتی چیای سەفین و (نانە کۆک) لە شەقلاوە لە ڕێگای هیران. دوای پێکاندنی ئامانجەکە، هێزەکانی پێشمەرگە دەستیان بەسەر سەربازگەکەدا گرت (دەباغ ، ٢٠٠٣، ل٧٨).

لەلایەکی دیکە چەندین بەش و دامەزراوەی دیکە لە پێکهاتەی سەربازی شۆڕشی کورد هەبوون لە نموونەی (فەرمانگەی گشتی ئەرکان) کە لەلایەن سوپا سالاری پێشمەرگە سەرۆکایەتی دەکرا و فەرمانەکانی لە مستەفا بارزانی فەرماندەیی گشتی هێزە چەکدارەکانی شۆڕش وەردەگرت (نانەکەلی ، ٢٠١٧، ل٤٣). دواتریش هەموارکردنەوەی دەستووری ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانی عێراق لەساڵی ١٩٦٨، هۆکاربوو بۆ دامەزراندنی بەشێکی دیکەی سەربازی لە نووسینگەی ڕاپەڕاندن بەپێی مادەی بیست و پێنج لە دەستوورەکەدا، کە ئەرکی ڕێکخستنی کاروباری سەربازی شۆڕش و کارکردن بوو بۆ پەرەپێدانی لەهەموو ڕوویەکەوە. ئەم بەشە بە ڕاوێژکردن لەگەڵ مەلا مستەفای بارزانی

و نووسینگەی راپەڕاندن، هەموو ڕێسا و ڕێنمایی و بریارە پێویستییەکانی بەپێی ئەو دەسەڵاتەی دەستوورەکە بۆی دیاریکردبوو، دەرکردوە (نانەکەلی ، ٢٠١٧، ل٦٩).

لەدوای دەستپێکردنەوەی شەر لە ئاداری ١٩٧٤، بەهۆی شکستهێنانی دانوستانەکانی نێوان کورد وحکومەتی عیراقی، بەفەرمانی مەلا مستەفا بارزانی و بەراوێژکردن لەگەڵ فەرماندە باڵاکانی لەشکری شۆڕشگێری کوردستان، دەستەیەکی تایبەت بە پلان و نەخشەی سەربازی لە ٤ ی کانوونی دووەمی ١٩٧٥ بەناوی (نەخشەکێشانی سەربازی) پێکهات، ئەرکی ئەم دەستەیە بریتی بووە لە چاوخشاندن بە ڕاپۆرتی فەرماندەی هێز و بەتالیۆنەکانی سەربازی بەشێوەیەکی مانگانە و دوای ووردبوونەوە لە ڕاپۆرتەکان، بریاری پێویستی لەسەر بابەتەکان داوە (بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد، بگ:٣،، ب: ١، شۆڕشی ئەیلول ١٩٦١_١٩٧٥ ٢٠٠٤، ل١٥٣)

## 5. مەشق و ڕاهێنانی پێشمەرگە

مستەفا بارزانی لە ڕۆژی دامەزراندنی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی کورد لە ١٩ی کانوونی دووەمی ١٩٤٨ لە باکۆی پایتەختی ئازەربایجان دەڵێت:"بۆ ئەوەی کوردستانی ئازاد مودافەعە بکرێ، پێویستە و فەرزە لەسەر هەموو فەردێک کە لەکوردستاندا دەژێت، مودەتێکی موعەیەن تەعلیماتی عەسکەری ببینێت و خزمەتی عەسکەری بکات" (بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد١٩٣١-١٩٥٨, ١٩٩٨، ل٣٥٨). بارزانی دەرفەتی ڕاهێنانی پێشمەرگەی لەسەر هونەرەکانی جەنگ دوای بەرپابوونی شۆڕش لەساڵی ١٩٦١ وەرگرت، بەمەبەستی بەرزکردنەوەی توانا سەربازییەکانی پێشمەرگە.

لەسەر ئەم بنەمایە لەساڵی ١٩٦٣، مەکتەبی سیاسی پارتی بەڕاسپاردەی بارزانی بریاریدا فێرگەیەکی مەشق و راهێنانی سەربازی بۆ پێشمەرگەکانی کوردستان بکاتەوە. لەو گێرگەیەدا بریاردرا فێرخوازەکان بە زانستە سەربازی و سیاسییەکان ئاشنا بکرێن، بۆ ئەوەی بتوانن وەک پێویست ئەرک و بەرپرسیارەتییەکانی سەر شانیان راپەڕێنن (خبات (جريدة)، ع(٤٧٢)، تشرين الثاني١٩٦٣، ص٦) (ئەحمەد ، ٢٠٠٨، ل٩٩_ ١٠٥).

پرۆگرامی مەشقی پێشمەرگە لەسەرەتای دەستپێکردنی شۆڕش بریتی بوو لە بابەتەکانی (ڕاهێنان لەسەر بەکارهێنانی چەک، نیشانەگرتن، خەملاندنی مەوداکان، بنەما سەرەکیەکانی ئاگر و جووله، فێل

و خۆشاردنەوە، بنەماکانی تفەنگ هاوێشتن، شەڕی تایبەت وەک( بۆسەدانانەوە، هەڵمەت بردن، مانەوە و خۆرزگارکردن لە شەڕ، فریاگوزاری سەرەتایی) (مراد ، ٢٠٢١، ص٧٢).

لەدوای کودەتای بەعسیەکان لە عێراق لە ٨ ی شوباتی ١٩٦٣، بەشێک لە شیوعیەکان کە هەندێکیان ئەفسەر و پلەداری سەربازی بوون، لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی عێراقی ڕایانکرد و هاتن بۆ ناوچە ئازادکراوەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕشی کورد، ئەمانە لەگەڵ هەبوونی ژمارەیەک لە کادیرانی سەربازی ئەکادیمی، بەیەکەوە دەرفەتیان بۆ بارزانی وسەرکردایەتی شۆڕش ڕەخساند، بیر لە دامەزراندنی فێرگەیەکی مەشق و ڕاهێنانی سەربازی بکەنەوە، بەمەبەستی دەوڵەمەندکردنی شۆڕشی کورد بە کادری ئەکادیمی سەربازی، بۆ ئەوەی سەرپەرشتی یەکەکانی پێشمەرگە بکەن. بەو هۆیەوە هەروەک لە هەوالێکی ڕۆژنامەی خەباتدا هاتووە، لەسەر فەرمانی بارزانی لە ناوەراستی تشرینی دووەمی ١٩٦٣، ئەکادیمیای شۆڕش دامەزرا (خبات (جريدة)، ع(٤٧٢)، تشرين الثاني١٩٦٣، ص٦).

سەربارى ئەوە، مستەفا بارزانی بە هەماهەنگی لەگەڵ فەرماندەیی لەشکری کوردستان، کاریکردوە بۆ کردنەوەی خوولی جۆراوجۆری سەربازی دیکە ، بۆ ڕاهێنانی پێشمەرگە لەسەر جۆرەکانی چەک و جوولانەوەی سووک لەناو شارەکان و هێرشی کەسی بەتاک. بۆ ئەم مەبەستەش چەند بنکەیەکی مەشق و ڕاهێنانی سەربازی دامەزرا، لەمانەش فێرگەیەکی مەشق و ڕاهێنان بەناوی فێرگەی کۆماندۆ (شەریف ، ٢٠١٢، ل٩٧) .

لە پێناو برەودان و ئاشناکردنی پێشمەرگە بە تازەترین زانیارییە سەربازییەکان، لەمانگی ئابی ١٩٦٥ یەکەم خوولی سەربازی بۆ ئەفسەرانی کورد کرایەوە، کە ماوەی سێ مانگ بەردەوام بوو (سیجف ، ٢٠١٦، ص٢٦٦). جارێکی دیکە لەساڵی ١٩٦٧ بۆ ڕاهێنانی پێشمەرگە لەسەر چۆنیەتی بەکارهێنانی چەکە قورسەکان، لەسەر ڕاسپاردەی بارزانی و لەژێر سەرپەرشتی مەکتەبی عەسکەری، خوولێکی دیکەی سەربازی کرایەوە. پرۆگرامەکانی بریتی بوون لە (خوێندنەوەی نەخشە و ئەرکەکانی ئەفسەرانی تۆپهاوێژ، ئەفسەرانی خەملاندنی پێوانە و بەکارهێنانی تۆپی(٢٥) ڕەتل و هاوەنی(١٢٠،٨٢،٦٠)ملم. هەروەها لە ١ی نیسانی ١٩٦٧ تاکو ٢٦ی ئەیلوولی ١٩٦٧ خوولێکی دیکە لە گەلالە لەژێر سەرپەرشتی مەکتەبی تەنفیزی بۆ شارەزاکردنی پێشمەرگە لەسەر بەکارهێنانی ئامێری بێ تەل کرایەوە (مراد ، ٢٠٢١، ص٧٣).

گۆڤاری قەڵای زانست
گۆڤارێکی زانستی وەرزی باوەڕپێکراوە لە لایەن زانکۆی لوبنانی فەرەنسی دەردەچێت-هەولێر-کوردستان-عێراق
بەرگی(٨) – ژمارە(٤)، پایزی ٢٠٢٣
ژمارەی تۆماری نێودەڵەتی: ISSN 2518-6566 (Online) - ISSN 2518-6558 (Print)

بەمەبەستی گفتوگۆکردن دەربارەی بارودۆخ و کەموکورتیەکانی شۆڕشی کورد و بەرزکردنەوەی ئاستی جەنگاوەرانی لە ڕووی ڕێکخستن و ڕاهێنانەوە، لە 15ی نیسانی ١٩٦٧ لە بارەگای مەکتەبی سیاسی پارتی لە ناوچەی کانی سماق نزیک گوندی گەلالە لە قەزای رواندوز و قەزای چۆمانی ئێستا، کۆنگرەیەکی سەربازی بە ئامادەبوونی مستەفا بارزانی بۆ فەرماندە باڵاکانی سەربازی ڕێکخست. ئامادەبووان باسیان لە چۆنیەتی ڕێکخستن و پێشخستنی هێزەکانی پێشمەرگە کرد لە ڕێگای بەرزکردنەوەی ئاستی ڕێکخستن و ڕاهێنان و ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو کێشانەی ئەو کاتە لە ئارا دابوون (محمد ، ٢٠٢١، ل٢٠٥).

لەو بۆنەیەدا بارزانی ووتارێکی پێشکەش بە پێشمەرگە کرد و لەتەوەرێکیدا دەڵێت:" ئەگەر دڵی میللەت لەگەڵمان بێ، دوژمن هەزارجار قوەتی زیاتر بێ، ناتوانێ بماشکێنێ، ئەگەر دڵی میللەت لەگەڵمان نەبێ... وەڵلاهی بە ئێوە بلێم هەزار دەفعە لە ئێستە بە قوەتتر بین... دەشکێین و ناتوانین نەجاحەت وەربگرین" (بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد، بگ:٣،، ب: ١، شۆڕشی ئەیلول ١٩٦١_١٩٧٥، ٢٠٠٤، ل٤٠٢_ ٤٠٨).

مستەفا بارزانی لە ووتارەکەیدا گرنگی و بایەخی بنکەی جەماوەری بۆ هەر بزاڤێکی رزگاریخوازی بەدیار دەخات، بەشێوەیەک وەک ئەو ڕێبەرە لە کرۆکی بابەتەکە گوزارشتی لێکردووە، کە هەر بزاڤێکی شۆڕشگێری بەبێ بوونی بنکە جەماوەرییەکەی، دەچێتە بازنەی چەتەگەرییەوە و لەبنەماکانی شۆڕشگێری دوور دەکەوێتەوە.

## 6. شێوازەکانی شەڕی پێشمەرگە

شەڕی پارتیزانی لەئەنجامی هاوسەنگ نەبوونی تواناکانی هێزی پێشمەرگە بەرامبەر سوپای عێراقی لە ڕووی ژمارە و چەکەوە، یەکێک بووە لە پلانە زۆر بەکارهێنراوەکانی سەربازی، کە بەدرێژایی شۆڕشی کورد لەلایەن مستەفا بارزانییەوە پیادەکراوە. گەورە شارەزای سەربازی سۆڤیەت شیشوف ئەلیکسی(Shishov Aleksey) باس لەوە دەکات کە هێزی پێشمەرگە توانایەکی زۆری لە پیادەکردنی ئەو شێوازە لەشەڕ بەرامبەر سوپای عێراقی نیشانداوە (Алексей , 2006, c.192). بەگوێرەی شارەزا سەربازییەکەی سۆڤییەت، ئەو توانا سەربازییە بەرزەی پێشمەرگەی کوردستان لە شەڕی پارتیزانی نواندی، بەشێکی دەگەڕایەوە بۆ شارەزایی و ئەزموونی سەرکەوتووی بارزانی خۆی لە

پیادەکردنی ئەو جۆرە شەڕە، بەو هۆیەوە وەک شارەزاترین سەرکردەی سەربازی لە هونەری شەڕی پارتیزانی دەیناسێنێ (Алексей , 2006, с.192). یەکێک لە بەڵگەنامە بەریتانیەکانیش ئەو ڕاستییە دوویات دەکاتەوە کە هێزە کوردیەکان، پلانی شەڕی پارتیزانییان، زۆر بە سەرکەوتوویی ئەنجامداوە (FCO - 51/191, 1971, p.22).

سوپا سالاری ئێران ژەنەرال رزم عەلی ئارا لەلای خۆیەوە لە هەڵسەنگاندنی توانا سەربازییەکەی ڕێبەری کورد مستەفا بارزانی، دوای ئەو بەریەککەوتنە سەربازییانەی لەگەڵ سوپای ئێراندا لەسالی ١٩٤٦ ئەنجامی دا، دەڵێت:"مستەفا بارزانی لە دووری ٥٠٠ مەتر نیشانە لەسەربازەکانمان دەگرێ دەیانپێکێ، ئەو توانایەکی زۆری لەشەری پارتیزانیدا نیشانمانداوە. بارزانی خاڵی لاوازی بەرامبەری بە ووردی دیاری دەکات و لەناکا و گورز دەوەشێنێ" (ارس (روزنامه)، ش(٧٧)، ١٠ اوربل ١٩٤٧، ص١)، هەروەها سوپا سالاری عێراقی لەماوەی شۆڕشی ئەیلوول، لەیاداشتەکانی خۆی نووسیویەتی ئەو کاتەی لە بۆنەیەکدا لەگەڵ بارزانی کۆبوومەوە، پێم گوت:" باوکی لوقمان، تۆ لەشەڕی پارتیزانی، باشترین سەرکردەی لەهەموو ڕۆژهەڵاتی ناوەراست" (الانصاري ، ٢٠١٩، ص٣٤٥).

بەشێکی دیکەی هۆکاری شارەزایی پێشمەرگە لە شەڕی پارتیزانی وەک لەڕاپۆرتێکی بالیۆزخانەی بەریتانیا لەبەغدا هاتووە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پاشخانە کۆمەڵایەتییەی هۆزە کوردیەکان هەیانبوو، ئەو ڕاپۆرتە باس لەوە دەکات کە: "کوردەکان لەباوک و باپیرانیانەوە فێری شەڕی پارتیزانی بوون، لەبیستەکان لە بەرامبەر ئێمەدا توانای زۆریان پیشانداوە ، ئێمە هەڵە بووین لەوەی وامان دەبینی کە کورد تەنها شەڕی بەرگری دەکەن و خۆیان لە هێرشکردن دەپارێزن و مۆڕاڵیان نیە، بەپێچەوانەوە توانای ئەوەیان هەیە. ئەوان لەو ئەفسەرە کوردانە فیربوون، کە لەسوپای عیراقی ڕایانکردوە" (حبيب ، ٢٠١٩، ص١١٦).

بەپێی زانیاری یەکێک لەبەڵگەنامە بەریتانییەکان، بارزانی شەڕی پارتیزانی بەکارامەیی جێبەجێکردوە. ئەمەش نەک وەک هەوڵێک بۆ دەستگرتن بەسەر شارەکاندا، بەڵکو بۆ ڕاکێشانی سوپای عێراقی بۆ ناو شاخەکان (FCO - 51/191, 1971, p.22). هەمیشە وابووە ئەو ناوچانەی کە سوپای عێراقی لە هاوین دەستیان بەسەردا گرتووە، لە زستاندا هێزەکانی پێشمەرگە وەریان گرتۆتەوە، لەبەرئەوەی بەفر و باران ئاستەنگی زۆری بۆ سوپای عێراقی لە پێشرەوی کردن بۆ ناوچە شاخاوییەکان دروست دەکرد (FCO- 51/358,1971, p.14).

فەرماندەیەکی باڵای سوپای عێراقی لە یاداشتەکانی خۆیدا باسی لە یەکێک لە نموونەکانی شەڕی پارتیزانی پێشمەرگە کردووە، لەو باسەدا ئەو فەرماندە سەربازییە ڕووداوی شەڕێکی هێزەکەی لەگەڵ دەستەیەکی پارتیزانی پێشمەرگە دەگێڕێتەوە، کە لە ١٤ی ئایاری ١٩٦٩ بە دوو قۆناغ لە گوندی سەنگەسەر و گوندی جیراوە ڕویداوە. ئەو دەڵێت:"بۆ یەکەمجاربوو کە هەڵگەڕاوەکان[مەبەستی پێشمەرگەیە] بەشداری شەڕی شەقام بە شەقام بکەن، لەبەرئەوەی مەشق و ڕاهێنانیان لەلایەن شارەزایانی سەربازی ئێرانی پێ کرابوو. شەڕەکە شەڕێکی سەخت بوو، پێشمەرگەکان سەنگەریان لەماڵێک دەگواستەوە ماڵێکی دیکە و خۆڕاگربوون و دەستیان نەئەدا و زیانی زۆریان بە ئێمە گەیاند، ئەگەر هێزەکانی تایبەتیەکانی سوپای عێراقی لەسەر شەڕی شەقام ڕانەهێنرابوونایە، زیانی زیاتریشمان بەردەکەوت" (النعيمي ، ١٩٨٥، ص١٠٠).

پلانێکی دیکەی سەربازی مستەفا بارزانی، بریتی بووە لە سوود وەرگرتن لە ماوەی ئاگربەست و دانوستان لەگەڵ حکومەتی عێراقی، بۆ بڵاوکردنەوەی هێزەکانی بەسەر زۆرترین و بەرفراوانترین ناوچە لە باشووری کوردستان. هەروەک فەرماندەی تیپی یەکەمی هێزی پیادەی سوپای عێراقی لە موسڵ باسی دەکات، کە سەرباری شکستهێنانی دانوستانەکانی ساڵی ١٩٦٣ی سەرکردایەتی کورد لەگەڵ حکومەتی عێراقی. بارزانی لە ڕووی سەربازییەوە دەستکەوتی زۆری بەدەستهێنا، بەسوود وەرگرتن لە ماوەی ئاگربەست، توانی هەژمونی شۆڕشی کورد بەسەر زۆربەی گوند و هۆز و ئاغاکان بسەپێنێ. هەروەها توانی دەست بەسەر ناوچەی دیکەی ستراتیژی گرنگ بگرێ، وەک تەنگەبەر و ڕێگا و لوتکەی چیاکانی بەسەر ڕێگا سەرەکیەکاندا دەیانڕوانی (فرحان ، ١٩٩٦، ص٨٩).

یەکێک لەبەڵگەنامەکانی حکومەتی ئەمریکاش ئاماژەی بەوەداوە کە توانای شەڕکردنی هێزەکانی بارزانی لەو ماوەیەدا زۆر بەرزترە بووە لەتوانای شەڕکردنی سەربازانی عیراقی لە ناوچە شاخاوییەکاندا (FRSU - 1969–1976 VOLUME XXVII, IRAN;IRAQ, 1973–1976, May 23,1974, p.694). هەرچەندە کردە سەربازییەکانی پێشمەرگە بەزۆری تەنها بەرگریکردن بووە، سەرباری هەوڵدانی بەردەوامیدان بۆ پارێزگاریکردن لەڕێگا سنووریەکان بۆ وڵاتانی ئێران و تورکیا و سوریا بۆ هێنانی کۆمەک و هاوکاری بەتایبەتی لە سنووری ئێران (FCO- 51/358,1971, p.14).

گۆڤاری قەڵای زانست
گۆڤارێکی زانستی وەرزی باوەڕپێکراوە لە لایەن زانکۆی لوبنانی فەرەنسی دەردەچێت-هەولێر-کوردستان-عێراق
بەرگی(٨) – ژمارە(٤)، پاییزی ٢٠٢٣
ژمارەی تۆماری نێودەڵەتی: ISSN 2518-6566 (Online) - ISSN 2518-6558 (Print)

ئەو پلانە سەربازییەی پێشمەرگە پیادەی دەکرد، هۆکارێک بوو بۆ ئەوەی لەبەرەکانی شەڕ بەرامبەر سوپای عیراقی کەمترین زیانی هەبێ، بۆ نموونەی یەکێک لە ژێدەرەکان باس لەوە دەکات کە لەشەرەکانی هێزی پێشمەرگە بەرامبەر سوپای عیراقی لە مانگەکانی تشرینی دووەم و کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٦٣ نزیکەی (٢) هەزار سەربازی عیراقی بەدیلی کەوتنە دەستی هێزەکانی پێشمەرگە، لەبەرامبەردا زیانەکانی پێشمەرگە (١٧٢) کوژراو بوو، تەنها یەک پێشمەرگەش بەدیلی نەکەوتە دەستی سوپای عێراقی. لەبەرئەوەی وەک ژێدەرەکە باسی دەکات"هێزی پێشمەرگە بەبیروباوەری کوردایەتی شەڕیان کردوە، بۆیە ڕێگایان نەداوە کەسیان دەستگیر بکرێن" (ادامسن و فتح الله ، ١٩٩٩، ص٢٠٩).

## 7. دەرەنجام:

لەم توێژینەوەی ئەنجامماندا، گەیشتینە ئەم دەرەنجامانەی خوارەوە:-

- مستەفا بارزانی یەکێکە لە دامەزرێنەرانی پێکهاتەی سەربازی ڕێکخراوی نیشتمانی کوردیی لە مێژووی هاوچەرخی کوردا.
- ڕێکخستنەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، لەسەرەتادا بەشێوەیەکی سادە و بەرنامە و پلانێکی سەربازی بە پشت بەستن بەئەزموونی ڕابردووی خۆی لەلایەن مستەفا بارزانییەوە دانراوە، بەڵام لە دوای ساڵی ١٩٤٥ ئەفسەرانی ئازادیخوازی کورد لە نیو لێژنەی ئازادی و پاشان ئەو ئەفسەرە کوردانەی لە ئەکادیمیا سەربازییەکانی سۆڤییەت بڕوانامەی سەربازییان بەدەستهێنا، هاوکاربوون، بۆ ئەنجامدانی گۆڕانێکی بنەڕەتی لە ڕێکخستن و دابەشکردنی هێزەکان بەسەر بەرەکانی شەڕ.
- مستەفا بارزانی ئەو سەرکردەییە بوو کە توانی پلۆرالیزم لە پێکهاتەی لەشکری شۆڕشگێری کوردستان دروست بکات، بەو هۆیەشەوە ڕۆڵەی کریستیان و موسلمان، کورد و عەرەب و تورکمان و ئاشووری و کلدان و ئێزیدی لەدەوری ئامانجێکی نیشتمانی کۆبکاتەوە و چارەنووسی هەمووان بەسەرکەوتنی شۆڕشی کورد ببەستێتەوە.
- هەرچەندە کەرەستە و پێداویستییە سەربازی و جەنگییەکانی لەشکری شۆڕشگێری کوردستان سادە و ساکاربووە، بەڵام بەدرێژایی ماوەی بزاقی رزگاریخوازی کوردی، حکومەتی عێراقی بەبێ پاڵپشتی ولاتانی زلهێز، نەیتوانیوە بەسەر هێزی پێشمەرگەی کوردستان زاڵ و سەرکەوتووبێ.

- مستەفا بـارزانی بەدرێژایی ئەو ماوەیەی سەرکردایەتی شۆڕشی کورد و فەرماندەیی لەشکری کوردستانی کردوە، هەمیشە لە دۆخی بەرگریکردندا بووە. ئەو شێوازەشی لەشەڕ بەرامبەر سوپاکانی عێراق و ئێران پیادەی کردوە، شەڕی پارتیزانی بووە، کە بەپێی زانیارییەکانی گەورە فەرماندەکانی سەربازی وولاتانی وەک عێراق و ئیران و سۆڤییەت، بارزانی بەهێزترین سەرکردەی شەڕی پارتیزانی بووە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

## لیستی سەرچاوەکان

### لیستی سەرچاوە کوردییەکان

#### أ) بیرەوەرییەکان

- دەباغ، خدر عەبدوڵلا .بیرەوەرییەکانم و تۆپخانەی شۆڕشی ئەیلوولی مەزن، ب٢ .هەولێر، ٢٠٠٣.

#### ب) لیستی پەرتووک(کتێب)

- بارزانی ,مسعود . بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد١٩٣١-١٩٥٨، دهۆک، ١٩٩٨.
- بارزانی ,مسعود .بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد، بگ:٣،، ب :١، شۆڕشی ئەیلول ١٩٦١_١٩٧٥ . هەولێر ,٢٠٠٤.
- دەحلێنەوی ,بێوار ئدریس .کامیران عالی بەدرخان ژیان و چالاکیێن وی یێن سیاسی و رەوشەنبیری ١٨٩٥-١٩٧٨ .دهۆک ،, ٢٠٢١.
- سەرنی ,هوژین مسعود .شورەشا ئیلونێ ل دەڤەرا بەهدینان ١٩٦١ -١٩٧٥ .زاخۆ ،, ٢٠١٨.
- شەریف ,هاوکار کەریم حەمە .شۆڕشی ئەیلوول( لێکۆلینەوەیەکی مێژوویی لە ڕێکخستن و چالاکییە سەربازییەکان ١٩٦١-١٩٧٠)، هەولێر ،, ٢٠١٢.
- عەبدولقادر ,نازناز محەمەد .سیاسەتی ئێران بەرامبەر بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی کورد لە کوردستانی عێراقدا(١٩٦١-١٩٧٥)، هەولێر، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس ,٢٠١٠.
- گەردی ,غازی عادل .پێشمەرگەیەک لە خزمەتی ڕێبازی بارزانی دا (حەجی بێرۆخی١٩١٦_١٩٧٥). ترکیا ،, ٢٠٢١.
- محمد ,د.شێرزاد زکریا .ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕەشی ئەیلوول لە کوردستان –عێراق ١٩٦٤-١٩٧٠، و: هەندرێن شێرزاد .دهۆک ،, ٢٠٢١.
- مەلازادە ,عەبدوڵا رحمان .شێوەی پێکهاتەی سەربازی شۆڕشی ئەیلولی مەزن .دهۆک ،, ٢٠٢١.

گۆڤاری قەڵای زانست
گۆڤارێکی زانستی وەرزی باوەڕپێکراوە لە لایەن زانکۆی لوبنانی فەرەنسی دەردەچێت-هەولێر-کوردستان-عێراق
بەرگی(٨) – ژمارە(٤)، پایزی ٢٠٢٣
ژمارەی تۆماری نێودەڵەتی: ISSN 2518-6566 (Online) - ISSN 2518-6558 (Print)


- نانەکەلی ,ئاری فاروق .ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆرشی کوردستان -عێراق)نووسینگەی راپەڕاندن ( دەستوور و یاساکان ١٩٦٤ -١٩٦٥ .هەولێر ,، ٢٠١٧.
- ئەحمەد ,نەوزاد عەلی .خەبات ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردستان)نیسانی ١٩٦٢ _کانوونی دووەمی ١٩٦٤(، .سلێمانی :بنکەی ژین ,، ٢٠٠٨.
- ئەردەلانی ,ئیسماعیل ،. نهێنییەکانی بارزان .هەولێر ,، ٢٠٢٢.

**ت) لیستی گۆڤار بەزمانی کوردی**

- ئەیلوول(گۆڤار)، ژ(١١)، ئاب و ئەیلوولی ٢٠٠٩.
- پەیامی .ئەیلوول(گۆڤار)، ژ(٢١)، تەمووزی ٢٠١١.

**ث) لیستی (گۆڤار و رۆژنامەکان بە زمانی فارسی )**

- ارس .دیروز رئیس ستاداریش برای روزنامەگاران اوضاع کردستان رابە تفصیل شرح داد .اطلاعات (روزنامە)، ش(٧٧)، ١٠ اوربل ١٩٤٧.
- اطلاعات (روزنامە)،ش(١٤٤٩٥)، ٢٨ اكوست ١٩٧٣.
- اطلاعات ،ش(٩٨٨٠)، ٩ فروردين ١٣٢٨.
- تهران مصو(مجلة)، ش(١١٧١)، جمعة ٢٢ بهمن ١٣٦٦، ١١ فوريه ١٩٤٤.
- خواندنيها .تهران(مجلة)،ش (٥٢)، ١٢مارس١٩٤٤.
- كيهان) .(روزنامە)، ش(٩٣٧٢)، ٤ مهر ١٣٥٣.

**لیستی سەرچاوە عەرەبییەکان:-**

**أ-لیستی پەرتووک(کتێب)**

- ادامسن ,ديفيد و جرجيس فتح الله .الحرب الكردية والانشقاق،ط .2اربيل :دار أراس للطباعة والنشر ,، ١٩٩٩.
- راندل، جوناثان. أمة في شقاق دروب كردستان ،كما سلكتها، ت: فادي حمود، ط1، بيروت،1997.
- حبيب ,شيركو .الكورد في وثائق الارشيف الوطني البريطاني(1958-1969)،ج2، القاهره، ٢٠١٩.
- د. أفرام عيسى يوسف. أزمنة في بلاد الرافدين- ذكريات و أحداث(1830- 1976)،. ترجمة: علي أبراهيم. دهوك، ، ٢٠٠٩.
- د.فاضل رسول. كردستان والسياسة السوفيتية في الشرق الاوسط. ترجمة غسان نعسان. بغداد: مؤسسة حمدي للطباعة والنشر، ، ٢٠٠٨.
- الرديني ,وصفي حسن .شهيد كوردستان(هرمز ملك جكو).دهوك ,، ٢٠١٠.

- سيجف ,شموئيل .المثلث الايراني، الكتاب الاول، العلاقات السرية الاسرائيلية الايرانية الامريكية .عمان : دار الجليل للنشر ،, ٢٠١٦.
- عصمت شريف وانلي. كردستان العراقية هوية وطنية( دراسة في ثورة 1961). ترجمة سعاد محمد خضر. السليمانيه، ، ٢٠١٢.
- غريب ,ادمون .الحركة القومية الكردية .بيروت :دار النهار للنشر ،, ١٩٧٣.
- كۆچى ,خالد خالد .السياسة السوفيتية تجاه القضية الكردية في الميزان .ستوكهولم ,١٩٩٠.
- نجم ,حيدر .معجم ضباط ثورة أيلول ١٩٦١ _١٩٧٥ .دهوك ،, ٢٠٢١.
- المصطفى ,أيفلين صلاح .الازمات الاقتصادية العالمية )كيف حاول الاخرون حل مشاكلهم .(دمشق :دار و مؤسسة رسلان للطباعة والنشر والتوزيع ،, ٢٠١٤.
- مراد ,حيدر نجم عبد .الاستراتيجية العسكرية لثورة أيلول (١٩٦١-١٩٧٥)، مراجعة :د .أزاد سالم محمد . دهۆك ،, ٢٠٢١.

ب-ليستى ياداشت

- النعيمي ,أسماعيل تايه ،. تجربتي في القيادة، ج1، دائرة التدريب )مديرية التطوير القتالي .(بغداد :مديرية المطابع العسكرية ،, ١٩٨٥.
- فرحان ,عبدالكريم .( حصاد الثورة )مذكرات تجربة السلطة في العراق ١٩٥٨_١٩٦٨،ط٢ .لندن :دار البراق ،, ١٩٩٦.
- الانصاري ,أبراهيم فيصل .أيام لا تنسى(مذكرات الفريق الاول الركن أبراهيم فيصل الآنصاري رئيس أركان الجيش العراق الاسبق)، .عمان :شركة دار الاكاديميون للنشر والتوزيع ،, ٢٠١٩.

ج) رۆژنامەكان بە زمانى عەرەبى

- خبات(جريدة)، ع(٤٧٢)، تشرين الثاني١٩٦٣.
- البارزاني يدلي بتصريحات هامة، خبات(جريدة)، ع(٤٧٦)، شباط ١٩٦٥.

**سەرچاوەكان بە زمانى ئينگليزى**

**أ) بەلگەنامەكان**

- CIA- 312/01101-72, Intention of Kurdish Leader Al-Barzani to Approach the United States Government for Assistance; Iranian Intelligence Request for Expression of United States Government Willingness to Overthrow the Ba'thi Regime of Iraq,Washington,March 9,1972. https://www.cia.gov/readingroom/document/0005715730.

- FCO-51/358. Research Department Memorandum the Kurdish Problem in Iraq, 1963-1971, 6 December, 1971.
- FCO-51/191. Research Middle East (The Kurdish Problem in Iraq 1963-1971). -, 1971.
- FRUS-1969–1976 VOLUME XXVII, IRAN;IRAQ, 1973–1976, Memorandum From Director of Central Intelligence Colby to the President's Assistant for National Security Affairs (Kissinger), Request by Mulla Mustafa Barzani to see Dr. Kissinger. Washington, May 23, 1974.
- FRUS -1969_1976, Volume E_4, Document on Iran and Iraq, 1969_1972, July 16, 1971. https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76ve04/d292.
- FRUS -1969_1976, Volume E_4, Documents on Iran and Iraq, 1969_1972, March9, 1970. https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76ve04/d267.
- FRUS-1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976, July 27, 1973.
- CIA-RDP79-00927A004800110003-7, April23, 1965. https://www.cia.gov/readingroom/document/cia-rdp79-00927a004800110003-7.
- FRUS-1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976, July 9, 1973.
- FRUS-1969–1976, Volume XXVII, Iran; Iraq, 1973–1976, March 29, 1973. https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76v27/d207.
- FRUS-1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976, September 6, 1973.
- FRUS-1969_1976, Volume xxxvll, Iran, Iraq, 1973_1976, November 2, 1974.
- CIA-173-7-14-7, Text of General Mulla Mustafa Barzani's, Letter to Secretary Kissinge. Washington,, November 2, 1974


### أ- كتێب بە زمانی ئینگلیزی


- Dann, Uriel. Iraq under Qassem,a political history, 1958_1963. New York, 1969.
- Gunter, Michael M. the Kurds of Iraq (Tragedy and Hope). New York, 1992.
- O'Ballance, Edgar. The Kurdish Revolt, 1961-1970. London, 1973.
- P.Chapman, Dennis. Security Forces of the Kurdistan Reginoal Government. United States, 2009.
- Rudolph, Joseph R. Joseph R. Rudolph Jr, Encyclopedia of Modern Ethnic Conflicts, 2nd Edition, Santa Barbara, 2015.
- Tahiri, Hussein. The Structure of Kurdish Society and the Struggle for a Kurdish State. USA: Mazda Publishers, 2007.


### ب- كتێب بە زمانی روسی


- Primakov, Konfiden͡tsialʹno. Blizhniĭ Vostok Na s͡tsene i za kulisami: vtorai͡a polovina XX--nachalo XXI veka. Moskva, 2006.
- Zhigalina, O.l. Мулла Мустафа Барзани (историческое фото), Институт востоковедения. Москва, 2013.

- Алексей, Шишов. Военные конфликты XX века. От Южной Африки до Чечни. Москва, 2006.
- Примаков, Евгений. БлижнИЙ Восток на сцене и за кулисами (вторая половина XX - начало XXI.2006.

**لیستی (ماستەرنامە و توێژینەوە زانستیەکان بە زمانی ئینگلیزی ):-**

- Khorsheed, Hussein M., the Role of Subnational Forces in Combating Terrorism during Civil War: The Case of Peshmerga of Kurdistan Region-Iraq AGAINST ISIS (2014–2017), Master of Arts in Security Studies. California: Naval Postgraduate School, 2020.
- Lortz, Michael G. Willing to Face Death: A History of Kurdish Military Forces- the Peshmerga - From the Ottoman Empire to Present-Day-Iraq. Florida: Florida State University, 2005.
- Waisy, Karwan Salih. "The Kurdish Peshmarga Force 1943-1975." Global Journals Inc, 2015.

## دور الملا مصطفى البارزاني في تأسيس القوة العسكرية الوطنية المنظمة (1943-1975)

**الملخص:**

أسم الزعيم الكردي مصطفى البرزاني مرادف لأسم وجوهر القضية الكردية في التاريخ المعاصر. وذالك لجهوده في تطوير حركة التحرر الكردي في القرن العشرين. أذ تمكن هذا القائد من إنشاء قوة عسكرية وطنية منظمة تسمى قوة البيشمركة الكردستانية، ، مرت هذه القوة بين عامي 1943 حتى 1975 بعدة مراحل حتى ثورة ايلول (1961-1975) ، مثلها مثل أي قوة عسكرية أخرى تابعة لمؤسسة وطنية ، لعبت دورها في الدفاع عن الهوية الوطنية وحماية شعبها. بعد أن تمكن مصطفى بارزاني من دمج قسم من القوات العشائرية الكردية بتشكيلة مثقفة و أكاديمية على دراية بالمبادئ العسكرية ، داخل جيش منظم ، من أجل ضمان أحد العناصر الرئيسية لحركة التحرير الكردية. كقاعدة رئيسية لنجاحه و استمراريته.

## Mustafa Barzani's Role on the Establishment of the Organized National Military Force (1943-1975)

**Qaraman hayder Rahman**
Department of History, College of Art, Salahadden University, Erbil, Kurdistsn Region. Iraq
qaraman.rahman@su.edu.krd

گۆڤاری قەڵای زانست

گۆڤارێکی زانستی وەرزی باوەڕپێکراوە لە لایەن زانکۆی لوبنانی فەرەنسی دەردەچێت-هەولێر-کوردستان-عێراق

بەرگی(٨) – ژمارە(٤)، پاییزی ٢٠٢٣

ژمارەی تۆماری نێودەڵەتی: ISSN 2518-6566 (Online) - ISSN 2518-6558 (Print)

**Prof. Dr. Saadi osman haruti**
Department of History, College of Art, Salahadden University, Erbil, Kurdistsn Region. Iraq
saadi.haruti@su.edu.krd

***Keywords***: *Mustafa, Barzani, Peshmerga, Kurdish, revolution.*

## Abstract

The name of the Kurdish leader Mustafa Barzani is synonymous with the name and essence of the Kurdish cause in contemporary history. For his efforts in developing the Kurdish liberation movement in the twentieth century. This commander managed to create a major shift in the Kurdish liberation movement by creating an organized national military force called the Kurdistan Peshmerga Force. Between 1943 and 1975, this force went through several stages until the September Revolution (1961-1975), like any other military force affiliated with a national institution, it played its role in defending national identity and protecting its people. After Mustafa Barzani was able to integrate a section of the Kurdish tribal forces with an academic intellectual structure familiar with military principles, within an organized army, in order to ensure one of the main elements of the Kurdish liberation movement. As a main basis for his success and continuity.